٢٠١٧

# ئەشق و مەرگ




ووتەکانی زیگۆ

# ووتەکانی زیکۆ



ناوی کتێب: ئەشق و مەرگ

بابەت: ووتە و شیعر

نووسەر: زیرەک جەبار عەزیز (زیکۆ)

تێبینی:- لە کاتی بردنی هەر بابەتێکم وەك رێزێك لە ماندووبوونم ناوم لەگەڵ بابەتەکە بنووسە زۆر سوپاس بردنی بابەتی نوسەرێك بێ ناوی نوسەر کارێکی زۆر ناشرینە بەڕای خۆم بۆیە لەکاتی بردنی بابەتەکانم یان بابەتی هەر نووسەرێك ناوی نوسەر بنووسی کارێکی زۆر جوانە .... "سوپاس بۆ خوێندنەوەی بابەتەکانم"

بۆ هەر رەخنە و پێشنیارێك دەتوانن پەیوەندیم پێوە بکەن لە رێگای فەیسبوك یان إنستاگرام




Facebook: Zirak Jabar Aziz
Instagram: ziko.official99

# ئافرەت...!

# یەک تۆز گرنگی پێ بدە..!

# دەتکات بە بەختەوەرترین پیاو..!



بیرکردنەوە لە ڕابردوو...

کات بەفیڕۆ دانی ئێستایە!



قوتابخانە و زانکۆکان پێناسە نین...!

بۆ زیرەکی و ئاستی رۆشەنبیری کەسەکان..!



پیاوەتی خۆتان بە زوڵم کردن

لە ئافرەت مەسەلمێنن..!

بەڵکو بە خۆشەویستی و گوڵ بردن

بۆ ئافرەت پیاوەتیتان بسەڵمێنن..!



لێی گەڕێن یارە نوێکەی چاوەڕێی دەکات...!

با بچێ لەگەڵ یارە نوێکەی قسە بکات...!

منیش ڕۆژێک لە ڕۆژان...!

یارە نوێکەی ئەو بووم....!!

کە زۆر تامەزۆری قسەیەکی بووم...!



ڕۆژێک لە ڕۆژان

تۆ وتت "تۆ هی منی"

منیش وتم "تۆ هی منی"

ئێستاش تۆ دەڵێیە

یارە نوێکەت "تۆ هی منی"

منیش دەلێمە

تەنیاییەکەم "تۆ هی منی"



ئەوەندە باوەڕم بە دۆستەکانم کرد..!

کە پشتیان شکاندم...!

دوژمنەکانیشم..!

فرمێسک لە چاویان نەدەوەستا...!!!



مرۆڤ لەداخی دوژمنەکانی خۆی

ناکوژێت ، مرۆڤ لە غەمی هاورێ و

خۆشەویستانی خۆی دەکوژێت...!



درۆ مەکە لەگەڵ ئافرەت..!

متمانە بکە بە ئافرەت..!

خۆشەویستیت دەربڕە بۆ ئافرەت..!

ئەوجا بزانە...

سۆز و متمانە و خۆشەویستی ئافرەت...

بۆ تۆ دوو ئەوەندە دەبێت یان نا..!



بە ئاوات یەک ماچ و

یەک باوەشی تۆ...!!

دەژیم..!

دەخۆم..!

دەخۆمەوە..!

دەخەوم..!

دەمرم..!



"ژیان" واتە "تۆ"!

"تۆ" واتە "ژیان"!



بەجۆرێ بێزارم لە ژیان!

ئەگەر مردوویێك گۆڕ بگۆڕێتەوە بە ژیان!

بۆ دوو دڵی لەگەڵی دەگۆڕمەوە ژیان بە گۆڕ!



ئازیزم لە بێ تۆیدا...

باش و ئاسوودەم..!

هەر وەک چۆن..

تۆ باش و ئاسوودەی..!



ئێمە بیر لە کەسانێک دەکەینەوە

کە ئەوان بیر لە ئێمە ناکەنەوە..!

ئەوانیش بیر لە کەسانێکی تر

دەکەنەوە کە بیر لەوان ناکەنەوە!

هاوکێشەیەکی زۆر سەیرە....!!



پێم باشە بە جلْ و بەرگی پیس و بۆن ناخۆش بگەڕێم!

نەوەك بە دڵێكی پیس و بۆن ناخۆش بگەڕێم..!

ئەوەی گرنگە دڵە دڵ نەوەك جلْ و بەرگی خاوێن!



"مرۆڤایەتی"

هەسارەیەکە هەزاران ساڵە وون بووە!

هەتا ئێستا نەدۆزراوەتەوە...!



ئەوەی دامنابوو بە هی خۆم!

ئێستا بوو بە هی ئەو...!



ئەو کارەی "ئەو" لەگەڵ "من" کردی..!

دڵنیابە "من" لەگەڵ "کەس" نایکەم..!



"هیچ"

شتێک نەما نەیکەم بۆ ئەوەی دڵی تۆ ڕازی بکەم..!

"بەڵام"

ئەو هات بە چەند پارچە کاغەزێک دڵی تۆی ڕازی کرد..!



ووتی تۆ ناشرینی!

کە جوانی دابەشکرا تۆ لە کوێ بووی؟

منیش خۆم تێك نەدا و ووتم:

ئەو کات و ڕۆژەی جوانی دابەشکرا!

لە هەمان کات و ڕۆژدا ئەخڵاق دابەشکرا!

تۆ چووی جوانی وەرگری و منیش چووم ئەخلاق وەرگرم!

تا من ئەخڵاقم وەرگرت جوانی نەمابوو!

تا تۆش جوانیت وەرگرت ئەخڵاق نەمابوو!



لە سەردەمێک دەژیم..!

ئەوەی ئەمرۆ ڕازی نییە بە ژیانی!!

بەیانی ئاوات بە ئەمرۆ دەخوازێ!!



دایمەن ئەوەی دوژمنی زۆرە

کەسێکی سەرکەوتووە...!

خەڵك دەیانەوێ وەك ئەو بن!

بەڵام کە ناتوانن وەك ئەو بن!

دەیانەوێ دوژمنایەتی بکەن و لەناوی ببەن!!



خوارزا...

وا بکە هاوڕێ و ئازیزانت پێت بڵێن

خۆزگە زووتر تۆم دەناسی...!

نەوەک وا بکەی هاوڕێ و ئازیزانت

بڵێن خۆزگە تۆم هەر نەناسیبا...!



تۆ ناتوانی هەستی مرۆڤەکان بگۆڕیت

بەرامبەر بە خۆت..!

کەواتە تۆش هەستی خۆت

بۆ هیچ مرۆڤێك مەگۆڕە..!



مرۆڤ کە ئاشق بوو!

ئەشقەکەی ئەتوانێ ببێتە هۆی بێزاربوونی لە ژیان!

ئەتوانی ببێتە هۆی دڵخۆشبوونی لە ژیان!



دڵخۆشی خۆم لە یەك زەدەخەنەی "تۆ" دەبینم...!



نیوەی کورد ڕقی لە ڕاپە..!

بەڵام ووشەکانی هەموو ووشەی ڕاپە!



خوارزا

لە ئەشقدا

لاواز بوون و سارد بوونەوەی

پەیوەندی هەیە بەڵام کۆڵدان نییە..!



من بە ئاواتی گەیشتن بە "تۆ" دەژیم..!

تۆش بە ئاواتی گەیشتن بە "ئەو" دەژیت..!



ئەوەندە زۆر گرنگیم پێت دا..!

تا خۆمم لەبیر کرد و تۆش لەبیرت کردم!



حەقی خۆتە لەخۆبایی بوون..!

ئەوەی تاوانبارە منم!

چونکە گرنگیم بەتۆدا..!



**کچەکە ناچار بوو ژیانێک بژی**

**کە "نەریتەکان" بۆیان هەڵبژارد...!**



ئەوەندەی بیر لە "تۆ" دەکەمەوە!

ئەوەندە "خودا" پەرستیم کردبایە!

بەدڵنیایەوە "بەهەشتم" بەدەست دەهێنا!



**لە گەورە بوونم پەشیمانم..!**

**لەگەڵ گەورە بوون تەنیا خەمەکانم گەورەتر بوون..!**



من وەک هەڵبژاردنی

پرسیارەکانی کۆتایی ساڵم!

چەند هەڵبژاردنێکت هەیە

یەکێک من و ئەوانی تر

جیاوازن لە من کامەت

هەڵبژارد پەشیمان بوونەوە هەیە!

تا کاتت هەیە کە کاتت کۆتایی

هات پەشیمان بوونەوە دادت نادات...!



مەحاڵ بوونی هەیە!!

ئەوەی ئەڵێ مەحاڵ بوونی نییە..!

ئەوە دڵنیابە نەیتوانییە زۆر شت لە

ژیانی بکات بۆیە ئەم قسەیە دەکات..!



له "ئەشقدا"

ئەوەی تۆ خۆشت دەوێ!

ئەو کەسێکی تری خۆش دەوێ!

ئەوەی ئەویش خۆشی دەوێ!

ئەویش کەسێکی تری خۆش دەوێ!



هەندێ جار پشت گوێ خستنی ئاواتەکانت

باشترە لەوەی ژیانت بکەیە دۆزەخ...!



## ئازیز گیان

پێویستە منیش
وەک هەورەکان بم بۆ تۆ
بۆ ئەوەی پێبکەنی و
خۆشبەختت بکەم لە ژیان
هەر وەک مەولانای ڕۆمی
دەفەرموێت
ئەگەر هەورەکان نەگرین
سەوزاییەکان چۆن پێبکەنن.!
من زۆر گریام و
ئیتر هەر دەگریم
ئەگەر تۆ بە گریانی من




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

پێبکەنی و خۆشبەخت بیت لە ژیان

من کەسێکم هەبێ بۆی بگریم تۆی

تۆش هیوادارم بە گریانی من

پێبکەنی و خۆشبەت بی

"خۆشمدەوێی تا مردن"



## ئەو ڕۆژەی..!

تۆ قەدری من دەزانی و هەست بە نەبوونی من دەکەیت!

لەوانەیە ئەو ڕۆژە بێت کە من لە ناو گۆڕم!

لەوانەیە بگەڕێیتەوە شار و بێیتەوە بۆ گەڕەکەکەمان..!

پرسیاری من بکەیت و کەسێک پێت بلێت...

خوالێخۆش بوو..

چەند ساڵێکە مردووە..!

لەوانەیە پرسیاری!

ئەو گۆڕستانە بکەی کە من لێی نێژراوم!

کەسێک پێت دەڵێت...

لە فڵان گۆڕستان نێژراوە...

تۆش دێیت بۆ سەر گۆڕم...




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

لەوانەیە بۆ من و یادگاریەکانمان بگریت!

لەوانەیە بڵێی زۆر بیرت دەکەم !

لەوانەیە بڵێی زۆرم خۆشدەوێی!

لەوانەیە بڵێی لێم خۆشبە!

بەڵام ئەو کات بۆ ئەم قسانە

زۆر درەنگە..!

ئێستا وەرەوە تا کات درەنگ نەبووە..!

بڵێ بیرت دەکەم!

بڵێ خۆشمدەوێی!

بڵێ لێم خۆشبە!



## شازادە گیان

تـــۆ وەرەوە تەنیا شتێ بە دڵم بڵێ

بـــا لەبێ تۆی لە لێدان نەوەستێ...

وەرەوە

وەک جاری جاران نامەم بۆ بنێرەوە

دڵی من خۆش بکە

ئای شازادە گیان دەزانی چەند تامەزرۆی

یەک دیدار و یەک ماچ کردنی تۆم

ئای شازادە گیان دەزانی

چەند بەحەسرەت دەست پێدا هێنانێکی

قژە ڕەش و خاوەکەتم

ئای شازادە گیان دەزانی چەند تاسەی یەک




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

باوەشتم ئێستاش وەک یەکەم ڕۆژی ماڵئاوایت
لە دیار وێنەکەت فرمێسک لە چاوم ناوەستێت
لە هەر شەقامێک کچ و کورێک دەبینم دەستی
یەکیان گرتوە و پێدەکەنن فرمێسک لە چاوما
قەتیس دەوستێت
شازادە گیان بیرت دەکەم
شازادە گیان دڵ دوای ماڵئاوایت
زۆر بە خاوی لێ دەدات
شازادە گیان گوێت لێم نییە
بۆ وەڵام نادەیەوە
بیرت دەکەم! بیرت دەکەم!



## تۆش بیری من دەکەی یان بەس من بیری تۆ دەکەم..؟!

خۆشەویستم..!

تۆش بیری من ناکەیت!

یان ئەوەتا بەس منم بیری تۆ دەکەم...

بیری ڕۆژەکانی بەیەکەوە بوونمان ناکەیت..!

بیری گاڵتە و خۆشیەکانی بەیەکەوە بوونمان ناکەیت...!

بیری لەیەک زیز بوون و تورەبوونەکان ناکەیت...!

من زۆر بیری ئەوکاتانە دەکەم..

نازانم تۆش بیری دەکەی یان نا..

لەوانەیە ئێستا لە باوەشی یارە نوێیەکەت بیت و

ئەو قسانەی بۆ منت کردوە بۆ ئەویش بیکەی..!

یان درۆ لەگەڵ یارە نوێکەشت دەکەیت و

دەڵێی "من هی تۆم ، تۆ هی منی"...؟




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

بەڕاست ئەمجارەش قسەکانی جاران دەکەیت!

بەڵام ئەمجارە بۆ من نا!

بۆ یارە نوێیەکەت قسە دەکەیت..

ئازیزم هیوادارم لەگەڵ یارە نوێیەکەت دڵخۆش بیت

هیوادارم درۆ لەگەڵ ئەویش نەکەیت و ئەویش

نەکەی بە کەسێکی ڕووخاو و وێران وەک من...!

دڵخۆشبە..! دڵخۆشبە..!

من درۆ ناکەم بە دڵخۆشبوونی تۆ..!

منیش دڵخۆش دەبم ئەگەر لەگەڵ کەسێکی

تریش بیت بەس تۆ دڵخۆشبە ئازیزەکەم..!!



نوسەر: زیرەک جەبار عەزیز (زیکۆ)

## من ئاشقی شازادەیەکم..!

ویستم تۆزەک وەسفی

جوانی ئەو بکەم...

بەڵام نەمتوانی وەسفی

جوانی ئەو بکەم...

هەرچی ووشەی

دنیا بوو کۆمکردەوە و

لە پەرتووکێک نووسیمەوە..

بەڵام نەمتوانی وەسفی

جوانی ئەو بە جوانی

مانگ و ئەستێرەکان بکەم..!

لە کۆتایدا نووسیم...




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

من ناتوانم وەسفی
حۆری و فریشتەکان بکەم..!
بەس دەزانم
حۆری و فریشتەکان
لە جوانی بێ سنوورن!
بۆیە دەڵێم شازادەکەم
تۆ فریشتەی یان حۆری!؟



## جەنابی یار..!

کاتی گەرانەوەت نییە!

نۆرەی گرنگی دان بەمن نییە!

بێ تۆ وەک منداڵێکی ناو بێشکەم

کە بۆ دایکی دەگریی...

وەک منداڵێکی ناو بێشکە

کە درەنگانی شەو

بۆ دایکی دەگریی

منیش بۆ تۆ دەگریم...

دایکەکە گوێی لە گریانی

منداڵەکەی دەبێ دەچێت

ژیری دەکاتەوە..!



تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

خۆرگە تۆش گوێت لە گریانی
من دەبوو و دەهاتی دڵم
بدەیتەوە...!
خۆرگە دەهاتی پێت دەوتم...
فرمێسکەکانت بسرەوە
ئیتر من گەرامەوە بۆ هەمیشە..!
زۆر چاوەڕێم کردی...
زۆری تریش چاوەڕێت دەکەم...
دڵنیابە تۆ لە دڵم دەمێنی تا مردن!
گەر زوو یان درەنگ بگەڕێیتەوە!
من چاوەڕێت دەکەم لە کۆتایی
دەڵێم "خۆشمدەوێی تا مردن"!



## چاوەڕێم...

ئەمجارە چاوەڕێی تۆ ناکەم!

چونکە دڵنیا بوومەوە

لەوەی تۆ نایەیتەوە..!

ئەمجارە وەک پیرە پیاوێکم...

کە تەنیا شت چاوەڕێی

دەکات مردنە..!

منیش چاوەڕێی مردن دەکەم..!

هیوام وایە لەوە زیاتر

چاوەڕێی مردن نەکەم...

چونکە چاوەڕێ کردنی

کەسێک یان شتێک زۆر ناخۆشە!




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

نوسەر: زیرەک جەبار عەزیز (زیکۆ)



زۆر چاوەڕێی تۆم کرد...

بەڵام تۆ دڵنیات کردمەوە

لەوەی نایەیتەوە...!

منیش بڕیارم دا دیسانەوە

چاوەڕێ بم بەڵام ئەمجارە

چاوەڕێی تۆ نـــا بەڵکو...

چاوەڕێی مردن دەکەم!! مردن!!



## ئەگەر ویستت کتێبێک بکڕی سێ بەش بوو کامە بەش دەکریت یەکەم جار؟

پیاوێک چوو بۆ کتێبخانە ویستی کتێبێک بکڕێ کتێبەکە سێ بەش بوو وتی بەشی سێیەم کۆتا بەشە کەواتە بەشی کۆتایی دەخوێنمەوە لە بەشی یەکەم و دووەم دەگەم و لە هەموو بەشەکان دەگەم بەمجۆرە ، بەشی سێیەمی کتێبەکەی کڕی گەڕاوەماڵەوە کتێبەکە بخوێنێتەوە چەند پەڕێکی خوێندەوە لە هیچ نەدەگەشت لە کتێبەکە نەیدەزانی باسی چی دەکات دواتر بینی لە خوارەوەی هەموو پەڕێک تێبینیەک بە ڕەنگی سوور نوسراوە خوێندیەوە نوسراوبوو "تێبینی:بۆ تێگەیشتن لەم کتێبە پێویستە بەشی دووەمی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە"




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

کابرا بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ کتێبخانەکە و بەشی دووەمی کتێبەکە بکڕێت بۆ تێگەشتن لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبە چوو بۆ کتێبخانەکە بەشی دووەمی ئەم کتێبەی کڕی گەڕاوە بەرەو ماڵەوە کتێبەکە بخوێنێتەوە دیسان چەند پەڕێکی خوێندەوە لە هیچ نەدەگەشت لە کتێبەکە نەیدەزانی باسی چی دەکات دیسان بینی لە خوارەوەی هەموو پەڕێک تێبینیەک بە ڕەنگی سوور نوسراوە خوێندیەوە نوسراوبوو "تێبینی:بۆ تێگەیشتن لەم کتێبە پێویستە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە" کابرا بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ کتێبخانەکە و بەشی یەکەمی کتێبەکە بکڕێت بۆ تێگەشتن لە بەشی دووەمی ئەم کتێبە چوو بۆ کتێبخانەکە بەشی




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

یەکەمی ئەم کتێبەی کڕی گەڕاوە بەرەو ماڵەوە کتێبەکە بخوێنێتەوە دەستی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە لە هەموو پەڕێکی ئەم کتێبە نووسرابوو "بۆ تێگەیشتن لە ژیان پێویستە لە سەرەتاوە دەست پێ بکەیت نەوەک لە کۆتا"

**ئامانج لە نووسینی ئەم بابەتە...**

" پێویستە مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە ژیان لە سەرەتاوە دەست پێ بکات نەوەک لە کۆتادا "



## تاقانەکەم..!

تۆم خۆشدەوێ قژ خاوەکەم!
تۆم خۆشدەوێ جوانترین
کچی گەردوون..!
ئاوات بە باوەشێکت
دەخوازم چاو جوانەکەم!
ئاوات بە بۆن کردنی
قژە ڕەشەکەت دەخوازم!
کاتێک سەیری تۆ دەکەم
وا هەست دەکەم
سەیری مانگ دەکەم..!




تێبینی: تەواوکەرەکەی پەری داهاتووە

کاتێک سەیری چاوە

جوانەکانت دەکەم..!

وا هەست دەکەم

سەیری ئەڵماس دەکەم..!

نازانم قژ ڕەشەکەم

لە مانگ دەچێ یان مانگ

لە قژ ڕەشەکەم دەچێت..!

قژ ڕەشەکەم نیشتیمانمە!

بژیم بۆ قژ ڕەشەکەم دەژیم!

بێ قژ ڕەشەکەم ناژیم!



## شازادەکەم

دەمەوێ بۆت بسەلمێنم

کە "خۆشمدەوێی"

بەڵام تۆ ئەو هەلەم پێ نادەیی

دەزانم من کەسێکی جوان و سەرنج

ڕاکێش نیم! ، بەڵام سوێند بەخوا

ئەوەی ئێستا باسی دەکەم...

هەمووی ڕاستی دڵمە...!

من تاکە کچ خۆشم بوێ تۆی!

تاکە کەس هەموو هیوا و ئاواتمە تۆی!

تاکە کەس بۆی دەژیم و دەمرم تۆی!

تۆش بێڵە بۆت بسەلمێنم...

کە "خۆشمدەوێی" بە زمان نا بە کردار!



چەندین جار ویستم نامەت بۆ بنێرم

ئەمنووسی "خۆشمدەوێی"...

دوایی ڕەشم دەکردەوە ..

ڕۆژانە ئەمەم دووبارە دەکردەوە...

هەر دەمنووسی "خۆشمدەوێی"....

ڕەشم دەکردەوە لە ترسی ئەوەی "لەدەستت بدەم"..!

ئێستاش نازانم چۆن پێت بڵێم "خۆشمدەوێی"

بێ ئەوەی "لە دەستت بدەم"..!



حەز ئەکەم بفڕم من بەرەو ئاسمان!

ببمە چۆلەکە بێمە سەربانیماڵتان..!

دەمێکە شەیدای دوو چاوی کاڵم!

ئاشقی باڵاو قژی تاڵ تاڵم....!

ئاشقی چاو و قژی خاوتم!

ئاشقی لێو و گەردەنتم!

دڵنیابە گیانە من ڕۆژێك هەر دێم!

لە بەر پەنجەرەت بە چرپە ئەدوێم...!

بەڵام ئەزانم ئەمەش خەیاڵە!

گەیشتن بە یارم خەونیکی تاڵە...!



منەتی کەستان هەڵناگرم

ئەوەی ئەڕوا با بڕوات...

دونیا زۆری ماوە....!

زۆر کەسی تر دەناسم!

زۆر کەسی تر من دەناسن!

زۆر کەسی تر جێم دێڵن!

زۆر کەسی تر جێ دێڵم!

ئەم ژیانە خۆی هەر ئەوەندەیە..!



# سوپاس بۆ هەڵبژاردنی ئەم کتێبە




## بۆ دەست کەوتنی ئەم کتێبە سەردانی ئەم ئەدرەسانە بکە

Facebook: Zirak Jabar Aziz

Link: www.facebook.com/ziko.official99

Instagram: ziko.official99

